* سەرابی ماسکەکان.
قەسیدەیەکی درێژە
دانا سەعید سۆفی
* بەرگ: سەردار سنجاوی
* دەرهێنانی هونەری: هەڵگورد عبدالوهاب
* پیت چنین: عمر عبدالله خۆشناو
* چاپی یەکەم ١٩٩٥
چاپخانەی زانکۆ
* تیراژ (٥٠٠) دانە
ژمارە (٥٣)ی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی دراوەتێ.

# پێشەکی

شەیتانم نەدەناسی فێری شەیتانە رەجیمیان کردم

تازە لە کوێن جوانیەکان

گەمەی ئەو منالانەی کە هێشتا فێری سیاسەت نەبوون

چرپە چرپی نێوان دڵدارەکانو جوانی ئەو کچانەی

تامەزرۆی نزیک بوونەوەن

نازی ئەو شەنگەبییەی کە بەسەر چەما لار دەبێتەوەو

منەت بەسەر ئاودا ناکات

گرمەی هەورو بروسکەو غروری کێوە بەرزەکان

خونسەردی ئەو دار سنەوبەرانەی خەریکە لە ئارامیدا

دەتوێنەوە

زەخمی رووبارەکان، ئەو رووبارانەی لە مەنفا.. لە دوور

دەستەکان ئیزدیواج دەکەن

دڵنەوایی ئەو سێوانەی لە باخەڵو لە زەمبیلی کچە

لادێیەک دان

ئەو ئەستێرە جریوەدارانەی چاوەڕێی گۆدۆیەکن لە دەستی

قەدەر رزگاریان بکات

ئاسمان – زەمین
ئەو گەدایەش کە لەبەردەری مزگەوت دانیشتووەو
بە کردنەوەی زەخرەفەکان خۆی تەسەلی دەدات

– ئەمانە هەموویان کەلامی خودان –
لە گەمەو چرپەو بروسکە
لە نازو نزیکبوونەوەو زەخم
لە غرورو چاوەڕوانیو قەدەر
لە زەخرەفەو ئارامیو سێو رامام
من لە کەلامی خودا ورد بوومەوە
شیعر نووسین دزی کردنە لە خوا
چۆن زاتت کرد دزی لە یەزدان بکەیت
من کەتنی خۆمم کرد .. ببوورە
لە کەلامت رامام، ببوورە
نهێنییەکانتم درکاند.

شیعر نووسین بەهرە وەرگرتنە لە ئەزموونی ئادەمو
دووبارە خواردنی سێوە.

# سەرابی ماسکەکان

لەو شوێنانەی
کۆترە باریکەکانی ئاژاوە
بە سمتە خڕەکانیانەوە
دەم دەنێنە شمشاڵی ئەو ڕێیانەی سەر دەریا تەی
دەکەن،
سترانێکی خەوندۆز هەڵدەبژێرم
بۆ نیوەی دەمەکانی هەڵچوونو
نیوەی هەڵپڕوکانی کوکەو گاڕانی
لەو دەڤەرە ڕۆژ بردوانەی
بێ سەرپەرشت لە نسێیان رام دەبوو.
لە بناری مەمکە خوناویەکان
ئایەتێک دەخوێنم
ئایەتی پەلەقاژێی هزرو گوزەرانی جەستە
بۆ ژنی گۆڕستانەکان –
ئێرە سەرزەمینی ماسکی جادوکەرانو سەمای
جومجومەکانە، لە گومانەوە هاتم، ئێمە بۆ دەوەڕین.
سەگەکان بۆ دەوەڕین، شەهوەتو کبر لە وەڕینمان

دادەگیرسان، لە بڕینی سەرهەڵگرتووی مەسیحەوە، لە ((فقرو عەشقو عفت))ەوە، لە دڕکەوە هاتم لە پشکوتنی بەردو ئاماژەوە– لە یەقین چوومەوە.

ئەوەتام–

باران دەمخواتەوە

لەودیو جەرەیانی وەسوەسەو نوورەوە

پەیکەری ئاوەژووی خوامان دەکێشا

رۆحێکی سەرشار لە میهرو دڵنەواییمان پێدا

یاقوتە ئاوریشمییەکانی مەمکی دەریا گومانیان

پێ خواردینەوەو

مەستی ساتێکی پڕ موچڕکەیان کردین

سیمام ون – دڵۆپێک لە رۆحمان بینی

دنیامان لە حەساسیەتی جەستەدا دۆزیەوە

پەیکەر، پەیکەری خۆمان بوو

وای لەو لەزەتە ئاوەژووە

دەروازەکانی گومان بە رووی گەلگەتاو عەدەن دابکەوە

دوا رابوونەوە ئاوەڵێ مەلۆتکەییو هەڕمین دەبێتەوە

بە ئاوارەییو گێژبوونو دەقگرتنەوە رام دەبێتەوە

پشت لەو کڵافە رێیە دەکەم

زەمەنی میناتۆرێ کێشی بکا

خەونی من پێخوست نیە

ئەم هەوارە ئارای کاتەکان، جلیتبازێی مێژوو نیە

ئاشور کارێزی سینەت نەخش بکا، بهێڵە
بێهەستی ئەم گێتییە بەسەر گەردە نەفرەتبارەکانی ئەم
خاکە تەی بکەن
شورەی چین دەکەین بە نێوانو بە تۆپەڵێک گزنگەوە
دەست هەڵدەبڕی

بۆئەوەی لە ئەزموونی ئاو بگەین
زێوانەکان ژیانیان دەکردە کۆلێرە
دەرکەوانی رۆحیشمان بوون
بۆئەوەی بوون دەمامک نەدرێ
شتێ جەستەم فەنا دەکاو
بڕێ لە عومری رۆحم درێژ دەکاتەوە
بۆئەوەی لە ئەزموونی خوا بگەین
لە پەنجەرە تاریکەکانی خۆرەوە
بۆ کوچە خۆشبەختییەکانی ئێمە دەڕوانی
رێ شەوارە – دەمەکان وەنەوزیان دەدا
کە هاتیە عەدەم، فەرامۆشی هاڕینی لغاو دەکرد
لەوێ کچەکانیان سەما بۆ نور خۆرەوەکان دەکەنو
ئاگایان لە پشیلە عارفەکانی مەیخانەش دەبێ
لەوێ منداڵەکانیان بە زیندە خەون فێری سیاسەت دەبنو
پیرەکانیش ناوانی بۆ عاشقەکان دەکەن،

لێرە وای خودای من زەمەنێکت نەیخواردمەوە

ئاماژەیەک لەسەرسامی بەهەشتی نەکردم

خەم لە پاشەلی سەرمەدی دەخۆیت

واژە سەرکێشەکان گردکەنەوە – یان رەها

خڕە ژنەکانی کەنار بوونم

هەگبەی ساتەکانم کەیلی پیاو چاکیو هەرمانی دەکەن

هەستەوەری لە نامۆیی رادەمێنن

نامۆیی لە کارخانەو دەست

خۆتمان بۆ واز بکە:

مەستی رەی لە بوونو سایەی تاوێرەکانم دایە

ئەو ساتەی مردم

ناوی ئەو باوکە پیرو ساکارانەم نەدەزانی

نانو شەرابو خۆڵەمێشیان دەدایە ئەو ئاسکە پیرۆزەی

بۆ رابردوو پەندمان لە زاری دەکردەوە

لە شار گەڕابوومەوە

ئەلفو بێی لەزەت لە کچە چاو پشیلانیو تامەزرۆکان فێر ببووم

ماچم لە گوڵە کێوییەکان دەخواستو

ژنە زاهدەکانم لەسەر لەتێ گۆشت بەشەڕ دەهێنا

شەیتانم نەدەناسی فێری شەیتانە رەجیمیان کردم

تازە لە کوێن جوانیەکان

ئێمە لە شون پێی خوداو سەرابەوە هاتبووین

ئەفرۆدێت لەسەرچاوان کەوتووە

نۆحیش با هەر کەشتیان چێ بکا

کە دێیە بوون بیانوت پێیە بۆ سەگەکانی ئاوایی

کە هەواری بوون دەگوێزیەوە

بردەوەکان بە خاوەن کەوە

لە سێوو هەڕمێنو هەزار پێ

بۆنی تۆفانتان بە گوێ ناگا

بۆنی بانگی الله أکبر

ئارەزوومە لە توێی نوژەنیەکا نقوم بم، ئێمە

کۆمەڵێ ئێسقانو روئیای یەکانەیی بووین

لەزەتمان لە سەرابو عیشقی ناپەیدا وەردەگرت

پەیژەکانی چێژو مەستی نەبا

فیردەوس بە ئارەقە لە نەهامەتیەکانی دەشۆردینەوە

ئاشی دەمە تەپیوەکان دەستیان بەسەرت دادەهێنا

من پێویستم بە نووستنی رۆح هەیە

پێویستم بە ئاوی سەر باڵی شەمشەمە کوێرەو

مەرگی یەزدان هەیە

من پێویستم بە مەرگ هەیە.

سەرەتا جەستەم رەهابوو، سێو ئەو تراویلکە جوانە لە بیری

بردمەوە

لەگەڵ گاڕانیو مۆزیکە رووتەکان رانەهاتم

چێژی بوون گەمارۆی دام، قوڵاپی کێشەکانم رژاندە هزری

خاکەوە

ئیدی ماوەکان رابوونو ئێمەش لە جەمسەرەکان گیرەی

ئەبەدیمان گرت.

زەمەن رژا

ساپیتەیەکو خاکێکی بێ زەمینم گرد کردەوە

لە پانتای زەمەنە پەراوێزو تراویلکەییو بێ بارەکانا لەزەت

هات

زەویو ئاسمان جوت برالە، دوو جەستەی قەشەنگ بوون

نەمدەزانی دەس بۆ کامیان بەرم

من چ تاوانم – لە رەوتی ئاو

زەمزەمەی باڵندە کۆچەرییەکان

چ تاوانم لە سەوزی چنارانو

وەرزی زاوزێو

سەمفۆنیای کەنارییەکان

من چ تاوانم لە پەیدایی ئەوان

بەتەنیاییو هەڕەمەکی هاتینە بوون

چاو درشتە بێ خەتاکان – بەبەرچاوی چاو

کونە سوژنەکانا

دەڤەرە بێ بارەکانیان دەبڕیو لەودیو

هۆشمەندیدا ئۆقرەیان دەگرت
بە دەرۆزە/ لە زەمینە بێ ئاسمانەکان، تیلمە زەمەنێکمان
دەخواستو
لەسەر نیمدەرە گوڵگوڵییەکان، ئارامیمان رادەخست:
ئارایە هۆشمەندییەکانو
وردە پێ بزۆزەکان سێدارەیان بۆ یاخیبوون هەڵدەواسیو
سەری ساتەکانیان دەخوارد
پێغەمبەرە چاو زەقەکانو کاوەی دادخواش
نازیان گرتبوو،
بە بیانووی خەڵوەتی دەروێشانە
لەگەڵ بورانەوەو کونجی شاعیرانە رادەهاتن:
گەر باڵندە قەدیمییەکان خۆیان بە زەمین هەڵواسی
ئاسمان سەری لە هەش گرتووەو زەمین چ خەتا
سایە پەراوێزنشینەکان خۆیان نەپچڕیەوە
ئاونا چیان بۆ دەکرێ؟
بە نزاو چارەنووسی خاکە تامساردەکان
وەرزی ئەفرۆدێت هات
بە لێواری خود دەگەم؟

چاوتیرە خاک ئاساکان –
نهێنیو شیری تیریان دەنۆشی
رازی شەهوەتیش بەسەریاندا دەڕشایەوە

بێهوودەیی ڕامالێنی سێبەرە داماوەکان
هەڕا هەڕای کوکەچیانو لاتەریکی بێ لێوار چ مانا.
ئیدی چاو ئەبڵەق بوون ئاوا دەبێو بچووکبوونەوە
لە خنجیلانەیی بۆ مەزنیو لاگیریو بەردو
ڕەهابوون
ئەو پەراوێز نشینانەی هۆشیان سڕدەکردو
جەستەیان هەڵدەچوو
خۆیان بە لچکی زەمەن هەڵدەواسیو
گەداییان بۆ گۆرانییەکی ئێوارەی دەریایی دەکرد،
کونجیان ڕادەخستو خەوێکی قاوەیی دەیبردنەوە
فەرامۆشی دەڕژا
ئاوێتەی گیانەلاییو سێبوری مردنیان دەکردم
قەیران قەیرانی من نەبوو
لەبیرچوونەوە پێشوازی کردمو تەڵەی پێغەمبەرانەم داناوە
ئیدی ژەنگیانە ئێمەی تەنیەوەو
لە خنجیلانەیی نزیک بووینەوە:
گۆیەکانمان ڕادەکوشیو
بە هەناسە دەمانمژین
هەورە لێو مشتەکانی کەلاکمان
لەسەر خاکە نەرمەکانی چاو تیرەکان خەست کردەوەو
بوون شاگەشکە بوو،
چیتر

**زەمینێکی بێ ساپیتەمان دەخوازی**

**بێوەژنەکانی دوورگەی بەهەشتیش**

**قژی جادوویان دەڕنییەوە**

**جاویدانی بەچی دەگا؟!**

**لە یۆتۆپیا ژیانو دۆزەخ خۆشکردن**

**پیاوچاکی نۆح نغرۆ ناکەن؟**

**هێواش – هێواش بۆماڵئاوایی‌و زیندووبوونەوە**

**ئیدی خواش لە خەڵوەتی نوێنو پەریاندایە**

**سێبوریش لە ملەی هیمالایا**

**شەوو رۆژان ناکاتەوە**

**ئیدی دەچینەوە نێو قۆزاغەکانمانو**

**بەرهەڵابوون**

**ئەوە چ دەستێکی نامەرئییە دەهێڵێ مناڵەکان بێ خەندە**

**بمرن**

**بۆ دەبێ خواکانی وڵاتەکەم لە تونێلی ئاشیانی خەوە**

**دزراوەکان رامێنن**

**ماسک هاتن– خۆیان رووت کردەوە**

**گۆڕستانەکان رابوونەوە– گەلگەتای من لە کوێیە.**

**لە روشناییەوە هاتووین**

لەودیو بێدەنگی نوردا

چاوەڕێی عیشقێکی عارفانە بووین

لە مەزەندەی عاشقبوون نزیکبووینەوە

بەگەرمی یەک خەون ئومێدەوار بووین

لەو خەراباتە کچەکان پێیان دەوتم رابوێرە

تا ئینتیهای مەحەبەت

تا ئینتیهای لەزەت

لە باغی عەدەن بە نور داوەتی عیشقو جەستەیان کردم

لە خشپەی باو هەنگاوی با غافل نیم

زمان بنێ بە هەنیەی بوونمەوە

ئەو سێوە دۆزەخیانە بڕژێنە باخەڵمەوە

ئەی ئافرەتە بێ بارەکە

با لینگانت سەرفرازتر لە حەماسەی مێژوودارا‌ن

بە هەڵچوونێکی رۆژهەڵاتیانە بمخۆرەوە

رووباری شیر لە جەستەت سەرەوژێر دەبۆوە

دڵت پڕاو پڕ لە سەڵیب بوو

هێندە مەستو شێت، لە نێو عەشقی بینیندا توابووتیەوە

سوڕەتێکی بێڕەحم ئەزەلییەتی ئێمەی پچڕاندو بە عاتیفەو

تەلیسم لێکی جوێ کردینەوە

دیوارەکانت پڕ لە خەونی پێغەمبەران دەکردو

لەش دەبووە خەراباتی ئاینەکان.

ئەم جیهانە دەست لێنەدراوەت چۆن بەسەر قاچە

کوێرەکان داداوە

قاچەکانم هەڵمگرن

قاچەکانم لەودیو حیلەی ئەسپەکانم نزیک کەنەوە

بە کام تاوانی وەهمی خۆ هەڵواسین

دەرگا هەبێ دیواریش دەبێ

زەمەن چرایی بێ، مەولای من

بە کام رۆشنایی دیوارا رۆبچین

لە جەستەی کام نەورەسی جاویدا

نورهەڵکەنین، گۆڕستانەکانتان

لێشاردینەوە، جەستە تەپیوەکانمان

لە کوێ بەجێبێڵین، دوای صعود

لە کام پەناگای ئەفسانەیی ئیبلیس دەمانخاتە روئیاوە

ئاشنایەتیم لەگەڵ سێبەران پەیدا کرد

شەهوەتی ئامۆژگاریان بەسەر رێمدا وەرکرد

خڕە ژنەکانیش مەمکیان دەڕژاندە کۆڵانەکانەوە

چاو خەواڵوە قامچی بەدەستەکان، مەمکە خڕەکانو

مەمکە وردەکانیان دەپلیشانەوە

بێئەوەی پەنوشتیو دوعانامەی باوکە تازەکانیان غوسل

لە خۆ دەرکەنو

درود بۆ مناڵە شەهوانییەکان بنێرن

خۆم بەو کلافە رێیە هەڵدەواسم

تا ئامۆژگاری لە غەنیمەکەم وەرگرمو لەگەڵ گەردوون تەبابم
لە دەڤەری ناپەیدا هەستەکانم پەرت دەکەم
وەسوەسەکانم کەرت
چاوە شەهوەتییەکان سنووری تەماشایان دەبڕی
باڵی قەقنەسەکانیان لە خۆ دەپێچا
رێوانەکان هەر یەکەو ئەستێرەیەکمان رادەدا
ژنە باکرەکان جەستەیەکیان بە رۆحماندا، لە تەوێڵەکان
سیمای مرۆڤمان خوێندەوە: لاسایی تولد، تصلیب،
صعود-مان کردەوە
لە روئیای رەوتە یەکانەییەکان دابووم، پێنج جەستەیان
خستە برینمەوە
ئەمە ئەفسانەی لە دایکبوون بوو.

رووباری هەوەس، رووباری جەستە
دەڕژانە هەرێمی تەنیا بوونو
بوونم لە نێو چێژە تەمەن کورتەکاندا بەندەیەکی بەوەفا بوو
هێشوەمار هات
خوای زوگورتی خەریکی سێو دروستکردن بوو
بە ئاوارەیی لە گەردوون
پێکەوە سەیری دەنگەکانمان دەکردو
گوێمان بۆ سیمای هاوەڵێک شل کردبوو
لە بۆشایی دوو لەت بوومو لەو ساتە بێ دایکەوە را

خۆم کۆدەکەمەوە

لەنێو جامێک شەرابو نور هەستمان بە زەمەن کرد

هەرچیمان دەخوارد دەبوو بە گیان

لەودیو ماچەکانەوە وێنەی خوامان دەدی

ئێمە کۆمەڵێک گیانی بێ جەستە بووین

زەمین پڕ لە باڵە کۆترو

لە ئاوی رۆحمان دەدا

لەودیو ئاوو برسێتی

سیمای هەڵگەڕاوەی خوامان دەدی

بە جەستە خۆڵەمێشیەکانمانەوە

لە ئەبەدییەتی رۆحمان دەڕوانیو خۆمان

بۆ ساتی بێسەری تەیار دەکرد

بێئەوەی سەرمان بە ئایندە بسپێرین

بێئەوەی پشتمان بە رابردوو بسپێرین

بێئەوەی تەنمان بە ئێستا بسپێرین

هۆشمان غلۆر دەکردەوە

مەرگی بەئاکام نەگەیشتوومان بە پەنجە نەرمی وە ئاگا

هێنان

خەواڵوو دەبوو

جەستە قڵێش تێبووەکان

غەرقی ئاماژەمان دەکەن

دانی عیشقم بۆ هەڵدەدان

تا کۆترە شەهوەتبازەکان سەرسام بکەم

بێئەوەی بە ئایەتی یاخیبوون ترس لە خۆ دەرکەن

سەریان بە شەپۆڵە خەونەکان دەسپارد

شەهیدە بێنازەکان، شەهیدە نازگرتووەکان

پەنجە نەحیفەکانیان لە دەمە ئێوارەیی‌و

پەمەییەکان وەردەدا

زەمەنیان بێدار دەکردەوەو

دەریایەک لە نور دەڕژایە نێو ئەو ئایەتەی هەردوو دایکم

بۆ بەرەبەیانەکانی باغی عەدەن دەیاندووری

شەوانە لەگەڵ شەهیدەکان هۆشمان سڕ دەکرد

ناز دەیبردنەوە، ئێمە

سێکس ناچاری کردین خیانەت لە ژیان بکەین

ئێمە خۆمان فرۆشتە ژیانە ئەبەدییەکان-

یادی ئاسنمان دەکردو

بادەی نورمان دەنۆشی

لەو شوێنانەی جادەکان دەسڕێنەوەو

خەونەکان کۆتاییان نایە، واژەیەک هەڵدەبژێرم

لە ساتی نزیکبوونەوە یا تێپەڕین

ئەو فریشتانەی داستانە شکاوەکانیان

دەنووسیەوە، شەڕەنگێزی بۆ خاوەنەکانیان دەگەڕان

**قەدەر دەمبەشێتەوە**

**پێنج جەستەیان خستە برینمەوە**

**قاچەکانم هەڵمگرن**

**ئەم برینانەم بۆ کام سەرداب دەبەن**

**نەخوا جاویدی پێبەخشیو نە زەمین، نە**

**هاتن لە پیاسەی ناو سێبەرانو ئاوایی مەنفاییەکان**

**دەشێ پێغەمبەری ئەمجارەمان شادۆت بێ**

**ئێمە دەنکە گەنمێکو خوایەکی دێوانەوارمان بەس بوو**

**بارانو زەویو ئاسمانت بەدوای خۆت دابوو..**

**لە زەمهەریرەوە بۆ تەمەنی ئایندەییمانت روانی**

**کاتی ناوک بڕین لێت جوێ بووینەوە، سەرابی عاتیفەو**

**مەلەکوتی ئاسمانمان بەدوای خۆمان کێش دەکرد**

**لە روئیاکانی لوسیفەر بە لەزەتتر نەبوون- بەشی**

**خۆمان لە فەنابوونی جەستەو واژە گوڵگوڵییەکان**

**بەسەر فریشتەکاندا بەشییەوە، شەو بوو**

**یا رۆژ ئێمە بۆ رووی خەتا هاتین، ئای**

**خودای من.**

**خوێنی بێنازی شەهیدەکان بەسەر عەدەمدا**

**دەبەشمەوە، ئێوە ئەی رۆڵەکانی یاریگەی خوا**

**بۆ بێوەژنە هەوەسبازەکان چیتان پێیە دەترسم**

**لەنێو لەپی خۆمدا ون دەبمو تارماییەکانیش نەدۆزمەوە**

**باڵە فڕێ بە ساتی نزیکبوونەوە بکەم .. نەتانبینی خوا**

**لەگەڵ منداڵەکانمان یاری دەکرد.. ئێمە چی بکەین بۆ**
**وەئاگابوون لە شەڕی نێوان جنۆکەکانو هەستکردن**
**بە سەرمەدی، نزیک دەبمەوە لە خود، من بووم**
**بە مەرگو خۆشەویستییەوە لە دایک بووم من .. من**
**بووم خەتای ئادەم.**
**ئەمشەو بە شیعرە مونتاژ نەکراوەکان خۆ گەمارۆ دەدەم**
**بە مۆسیقا پەرتەکان سەمای کۆسەبەباو رۆح ساز دەکەم**
**ئەمشەو شەوێکی خودایی باڵ تەزیو بۆنی سۆزو**
**سیماتم پێچایەوە، ئەمشەو لە یەخەی کوشتنمان**
**دەکاتەوەو خودمان حەلال دەکا، قوڕ قەپ لە مێژوو**
**دەکەن،**
**نزیک بوویەوە.. تامەزرۆیی سەرەتاتکێی دڵۆپی فرمێسکو**
**بووکی بەرباران، با گەمییەکانی رۆح هەست بە نامۆیی**
**نەکەن. شەهوەتی دوای گریەو رۆچوونی سووتانەکان**
**منیان هێنایە گەمەی بوون و نەبوونەوە، تاوێرو**
**گیرەیەکی سەرمەدیانە دڵنەوایی مانگو دەشتاییەکانیان**
**دەدایەوە تۆفان.. بەخێربێیتەوە ئەی تۆفانی**
**دوورە زێد لە هەڵبەزو دابەزی دیرۆکتابوویت، لە ئاستانەوە**
**مەی بارانی گەردوون بکە، خوایەکان لە جادو،**
**گوڵە دۆزەخ دەربازکە**

لەپی شمشاڵتان نەخوێندەوە
دەروێش خەڵوەتو وڕک جێدێڵێ، وڕک
بە تاوێرەوە دەگرێ
ناخت بە ئێوارە دەمەکان بسپێرە
ئاوە گیرەگرتووەکان حەز دەکەن گەرما بردووبن
سەرزەمینی تەنێبوونو تەرمە بێ ئاڵاکان، سەمای
پەتیبوونو ئاوێتەبوونی نێومان وازبکە، شەهیدان
زامی گۆڕینی گیرەو سەرابن.
دەروازەیەک بۆ نوێژەکان لە فیردەوسو سزاکەینەوە
خەمەکان بە ئازادی یەک یۆتۆپیای دوای هەرەس
لە تەنکایی واتایەکا باڵا چراییان نیشاندام
بەسەر بڵندایی خەندەیەکدا سێبەر لە گەردوون دەگرم
لە چین چینی دەقێکی گومڕا، ئارام.. ئارام
سووتووی هەناسە سواریم داگیرسێنە..
لە لێواری نایەکانت

بەرەو

پەرسڤی سەراپا

لەزەت لە کوختو هەڕاجخانەکان دەدزم
هاڕینی دەمەکان دەزانن
لەگەڵ شەیتانەکانم گفتم کردووە
دەڕشێمەوە ناوت ئاونگی باڵندە دەنوک چەماوەکان
وەرزی هەراسانی گەیشتووە

پف بە شەیپوورەکانی جەهلەوە بکەن
نەورەسە سک پڕەکان چیدی نور ناڕژێنن
دەی.. فریشتەی ئاژاوە شادۆتمان بۆ باشوورکە
بۆ خۆ لەبەر ئاوێنەی ئارمانشار رابخەین‌و
ناوکەکانی گێچەڵو شەهوەتو ماڵئاوایی
بدۆزینەوە.
شادۆت بوون‌و نەبوون دەخاتە گیانەڵاوە
شادۆت سایەبانی پەلکەزێڕینەو باران‌و خودایە،
دەی چۆڵبوونی پاسارییە باڵ تەزیوەکان
بە شنەی حەزی رام نەبوو خوساوم کە
لە ئاوی پاش بارانی جەستەو خۆڵمان هەڵکێشە
هەر مریەمەکان دوا شەونمی تەوێڵی ئاوابوون
دەسڕنەوە
با لە نسێی وردبینیدا بڕازێین
سەری گەردوونمان پێچاوەتەوە
زەمەنە چاودیدەکان بوون، بە چاوی شەیتان پێکەنین‌و
جورجەکانیان کازیوەدار کرد..
جورجەکانی چاوی شەهوەت بەسەر
نیمدەری خاودا هەڵدەگەڕان
بەمن چی سیمای خوایی سپی دەبێتەوە
لە ساتە بێ پەناو خەیاڵەکان خۆم پایەدار کردووە
هێشتوە دڵێ رۆژهەڵاتین

**لە تەویڵەکان لاسایی لە دایکبوون دەکەینەوە**

**لە کۆڵانەکانی هەڕمین بۆ دەروازەی فانیو**

**نیگا بەخەسار دەدەین**

**وڵاتی خەتا**

**ئەو شەوانەی کە لە شەڕ دەگەڕاینەوە**

**خۆمان مەست دەکرد**

**ئێمە هەراسمان لە مەرگ نەبوو**

**وەلی لەزەتێکی چاوەڕوان نەکراو**

**بەری شادمانیو نوری لێگرتین**

**نە کەلاوەی یادگار نە خاکی مەوعود**

**سایە لە رۆشناییمان ناکەن**

**هیچو قەدەرمان دایە ئێستاو**

**چیتر**

**هەموو شتێ سەرەتاییو جایزبوو**

**خۆمان بەعەدەمەوە هەڵواسی**

**لە عەدەمەوە هاتین**

**لە عەدەمێکەوە بۆ عەدەمێکی تر**

**کە لە حاڵ بوومەوە**

**ئەستێرەکان بەسەر رووخسارتەوە بوون**

**– پێکوتانی تێکەڵاوبوونێکی تیشکاویژ–**

**نور بوو گۆناکانی فێنک دەکردیەوەو**

واژەکانمان لە عەدەمەوە دەرچوون

لە وڵاتی خەتا

سڵاو لە کچە باکیرەو قەشەنگەکان.

شۆڕش، سەراب

ژن، سەراب

هەندەران، سەراب

بەسۆزو سمێڵی رۆژهەڵاتیمەوە

چاوەکانی نوشوستی سەراب دەخوێنمەوە

ئەوەتام – سڕبوونی کونجەکانو دڵە ماتەکانی – کیف

ئەوەتام.. چرایەکی باڵ تەڕ

ونبوونی ساتە هەمیشەییەکانی هەولێر

ئەوەتام .. چاوڕامکردنو

ناوکی مۆسیقایەکی گەرەلاوژەیی .. ئەستەنبۆڵ

ئەوەتام لە بێدەنگی پێیە زراڤەکانی گلێرەو قۆزاغە

ئەوەتام.. ژاوەژاوەی ئەودیو خلسەو

ساتەکانی منگەمنگو تەتەڵە.. لێرەم لە مەلەکوتی واژە

بە ئەزموونەکانی شکستی سەرابدا دەچمەوە

مەرگێکی موسافیر بووین ئەو شەوانەی

خەونە دێرینەکانمان بە بادەداو

ڕەنگە ئاڵۆدەییەکانمان یەخسیری دەمەزەقەکان دەکرد
ئەو دەمە ئەسیرانەی، نهێنی تراویلکەم
دەدایە ئیمامە شۆڕشگێڕو ئاور بەدەستەکان
لە بوڵێلا لەگەڵ برا یەقینییەکانیان راهیبە پاکیزەو
تەوەزەلەکان، نامەی جنسو مەحەبەتیان دەگۆڕییەوەو
ڕەنگی مۆزیکو سروشتیان لێک
دەشاردەوە
مەرگێکی دەستەمۆی موچڕکەو درۆ بووین، لەو رۆژە
شیرینانەی
فرمێسکی شوشەم دەبەخشییە ئەو کچانەی
مەمکیان دەهێنایە بەر تەماشام
ئەو خەونە کریستاڵیانەی بە ئاوی سەرابو
بەنازی شەهیدەکان گۆشمان کردبوون
ئەو خەونانەی لە ئاژاوەی دەریاو راسانی نۆحەوە
ئاوێتەی سێبەرێکی چەماوەیان دەکردین
ماچێک دەمخواتەوە.. هەوری پیتو لەزەت
جەستە یەقینە- جەستە گومانە
زەخرەفەی بەردەری مزگەوت - ماچێک
لە مێژووم دەشواتەوە
ماچێک مەنفای شتەکانە
ماچێک لە سەرابو لە خوام نزیک دەکاتەوە

برا عەتیقەکانمان

ئێمەو ئەو برایانەی

بزمارێکمان نەبوو تاقەکانی پێ بنەخشێنین

ئێمە، ئەو برایانە لە حەقانیەتی مادە هەڵدەچووین

ئێمەو ئەو برایانەی زەمەنەکانمان مۆمیا دەکرد

ئەو زەمەنانەی بەسەر لاشەی براکانمان سترانێکی دەمەو

ئێوارەییمان دەچڕی

پێویستیمان بە خوێندنەوەی دەریاو، تووڕەیی خوایەکان نەبوو

گەرەکمان نەبوو بە ئەزموونی تەوێڵەکاندا بچینەوەو

لاسایی ئایەتە ئاوییەکان بکەینەوە

ئێمە خۆمان بووینو بەس – تازە بۆ کوێ –

لە کام دەمی وەنەوشەییو

لە کام ساتی سەرەتایی

زەردەشت بکەین بە گۆرانی – تازە لە کوێ

ماڵئاوایی لە گوڵساریو مردووەکانمان بکەین

ئێمە زەمەنێکمان نەبوو – زەمەنێکی غەریب –

بۆ شانازیو هەناسەدانو خەو درووین

بەرەو لاتان دێم رووخسارە سێگۆشەییو خڕەکان

مۆزیکی جەستە نەخوێنم لە ئاوەڕۆی شەیتان دەدەم

سەرمان بسپێرە بەو روئیایانەی لە سەرابا

خوا سێبووریمان دەدا

**ئەو باخچانەمان بێنە بەر تەماشا کە زەماوەندی**

**ئەهریمەنەکانی**

**تیا ساز دەکرێ‌و شەهێنەکانی لە ساتی ئاسوودەیی دەگەڕێن**

**بچینەوە – بە دڵنەوایی مەرگو**

**ئەو بۆشاییەی راموسانی تەنێکی پڕ هەست ئاوازەی**

**رێحانەی تیا دەڵێ**

**بچینەوە بە قووڵایی گوماندا – بچینەوە بۆ قۆزاغە.**

* وڵاتەکەم مشتێ بێ حورمەتی بوو.

بەشێک لەم سەرابە چەکدارە کوردەکان سووتاندیان

* بردەوە: ئەو شتەیە کە دەبێ بدرێتەوە..

* ئەم سەرابە سێ ساڵە ئامادەی خۆنمایشکردنە.

دوا پاکنووسی سەرەتای ١٩٩٥ بە ئاکام گەیشتووە.

* لە زۆر دانیشتنی تایبەتدا هاتۆتە ئارا.

**بەهاوکاری بەڕێزان**

**فەرهاد جەمیل خەیلانی**

**شێخ فەزل صافی هیرانی**

**نەهرۆ سەعید سۆفی**

**جەلال محەمەد ئەحمەد**

**((سەرابی ماسکەکان))**

**خۆی نمایان کرد**

**ڕێزو سوپاسم بۆیان**